له بڵاو كراوەكانی ماڵپەڕی بەهەشت

# ئامۆژگاری بۆ كچانی موسڵمان پێش هاوسەرگیری


ئامادەكردنی

دایكی ئالاء


-----------------------------------------------------------


ماڵپەری بەهەشت

ba8.org

ماڵپەڕێكی ئیسلامی زانستی پەروەردەیی یە و لەپێناو بڵاوكردنەوەی ئەو ئیسلامەیە كە سەلەفی صالّح - پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) لەسەری بوون - وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێكی حیزبی نیە.

## ماڵپەری بەهەشت

**ئەو کتێب و بابەت و لێکۆڵینەوە شەرعیانە بڵاو دەکاتەوە کە دەبنە هۆی:**

١. شارەزاکردنی موسوڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە ڕەسەنەکەی ئیسلام،کە بریتی یە لە قورئان و سوننەت،بە تێگەشتنی پێشین وپێشەوایانی ئوممەت.

٢. پاک کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسوڵمانان، لە دیاردەکانی شیرک و کوفر و تاوان.

٣. پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان.

٤. وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان.

٥. پتەو کردنی برایەتی یەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی.

**ئامانجمان:**

ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراوی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەڵایەتی.

**خودایە داوات لێ دەکەین دامەزراومان بکەیت ، وتەوفیقمان بدەیت بۆ هەر کار وگوفتارێکی جوان وچاک بەو شێوەیەیی کەخۆت لێی ڕازیت.**

**ستافی ماڵپەڕی بەهەشت**

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحمد لله نستعينه ونستهديه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله ، وأنَّ محمدا عبده ورسوله .. وبعد..

**پێشەکی: لەچاکەی خوای گەورە بۆ نەوەی ئادەم و ڕێزلێنانی ئەوەیە کەهاوسەرگیری بۆ داناون و کردوویەتی بەبەخشینێك بەسەر بەندەکانیەوە:** {وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً} (سورة الرعد:٣٨).

**واتە: لەپێش تۆوە ئەی موحەممەد (ﷺ) چەندەها پێغەمبەرمان ناردووە وەخێزان و نەوەیشمان پێ بەخشیون.**

**ئەم شتەی لەبواری بەخشش دەرخستنی فەزڵ و چاکەی خوای گەورە بەسەریانەوە باس کردووە.. ئیسلام هاوسەرگیری پێ خۆشەو هانی خەڵکی دەدات لەسەری و بەیەکێك لەنیشانەکانی خوای داناوە:** {وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ} (سورة الروم: ٢١).

**واتە: یەکێك لەنیشانەکانی خوای گەورە ئەوەیە کەلەخۆتان ئافرەتی بۆ دروست کردوون (مەبەست حەوایە کەلەپەراسووی ئادەم دروست کراوە) بۆ ئەوەی ببن بەهۆی پشوو و ئارامی بۆ پیاوان، وەسۆزو بەزەیی و خۆشەویستی خستۆتە**

**نێوانتانەوە، بەڕاستی لەم شتەدا چەندەها نیشانەی گەورەیی خوای گەورەی تێدایە بۆ کەسانێك کەبیربکەنەوە.**

**١ـ هەڵبژاردنی پیاوێکی موسڵمانی چاك، ئیسلام هانی خەڵکی ئەدات لەسەر چاك هەڵبژاردنی پیاو کەخاوەنی ڕەوشت و دین و پاکی بێت، خوای گەورە دەفەرموێت:** {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} (سورة الحجرات: ١٣).

**واتە: بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوای گەورە خواناسترین و خۆپارێزترینتانە لەتاوان.**

**وە دەفەرموێت:** {وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} (سورة النور: ٣٢).

**واتە: ئێوە هاوسەرگیری بکەن و لەچاکەکانتان بخوازن لەبەندەی پیاوو ئافرەت، وەئەگەر هەژار بن ئەوا خوای گەورە بەفەزڵ و چاکەی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات. بەڕاستی دەوڵەمەندی خوای گەورە زۆر فراوانە، وەزۆر زانایە.**

**با ماڵ و پارەو ناوبانگی و جگە لەمانە هەڵت نەخەڵەتێنێت، بەڵکو یەکەم شت کەسووربن لەسەری با بریتی بێت لەدامەزراوی لەسەر دین و ڕەوشتی جوان، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** "إذا أتاكم من ترضون خلقه ودينه فزوجوه، إلاّ تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد كبير" (رواه الترمذي).

واتە: ئەگەر هەرکەسێك هاتە داخوازیتان و ڕازی بوون لەدین و ڕەوشتی ئەوا پێی ڕازی بن، ئەگەرنا ئەوا ئاشووب و خراپەی گەورە لەسەر زەویدا بلاْودەبێتەوە.

٢ـ خۆت بپارێزە لەهاوسەری کەسێکی زیناکەر، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: {الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ} (سورة النور: ٣).

واتە: پیاوی زیناکەر کەس ناخوازێت تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود هاوبەش بڕیاردەر نەبێت، وەئافرەتی زیناکەریش هیچ کەسێك نایخوازێت تەنها پیاوی زیناکەر یاخود هاوبەش بڕیاردەر نەبێت، بەلاّم ئەم شتە قەدەغەو حەرام کراوە لەسەر بڕواداران کەئافرەتی زیناکەر یاخود پیاوی زیناکەر بخوازن.

**ئیمامی إبن کثیر فەرموویەتی:** أي حرم تعاطي الزنا والتزوج بالبغايا أو تزويج العفائف بالرجال الفجار".

واتە: زیناکردن و خواستن و شووکردنی بەزیناکەر حەرام کراوە.

٣ـ باشتر وایە پیاوەکە لەو کەسانە بێت کەسوورن لەسەر فێربوونی زانستی شەرعی و خوێندنەوەی پەرتووکی بەسوود، بۆ ئەوەی تێگەیشتن و پەیوەندی نێوانتان ئاسان بێت و هاریکاری یەکتر بکەن لەسەر چاکەو لەخواترسان و فەرمان کردن بەچاکەو بەرهەڵستی کردن لەخراپە. وەپێشەوایەتیەکی باش بۆ تۆ هەیە لەدایکانی باوەڕداران و ئافرەتانی پێشینەکان.

## قۆناغی داخوازی کردن

١ــ هەنـدێك لەکچـان زۆر دوو دڵـن لـەبڕیاردان بـۆ شـووکردن و یەکلاکردنـەوەی کارەکـەیان، داوا لـەداخوازیکار دەکـەن کەڕێگـەیان بـدەن بـۆ ماوەیـەکی زۆر بیربکەنەوە تـاکو بـزانن چـاکە یـان خراپـەو زیـان و قـازانجی لێـك بداتـەوە، ئەمـە کارێکی چـاکە بەمـەرجێك کاتەکـە زۆر نەخایـەنێت و لـەڕادەی شـیاو دەرنەچـێت، کاتێك داوای وەڵامی لێ کرا ئەڵێت ئارام بگرەو بیردەکەمەوە، ئەمـە کـارێکی شـیاو نییە، بەڵکو کاتێك دیاری بکە بۆ بیرکردنەوەو نوێژی (إسـتخارة) بکـەو دوعـا بکـە هـەروەکو چـۆن پێغەمبـەر (ﷺ) فێرمـانی کـردووە، وەپـرس بکـە بەکەسـانێکی باوەڕداری متمانە پێ کراو پاشان کارەکەت بسپێرە بەخوای گەورە.

٢ـ ئەو شتانەی کەدەتەوێت باسی بکەیت کاتی یەکتر بینین واباشترە بینووسیت و ئامادەی بکەیت.

٣ـ خۆت ئامادەبکە بۆ یەکتربینین نەك بەشێوەی سـەرقاڵی کـاری تـرەوە، یـاخود لەکاتی نەخۆشی.

٤ــ واباشـترە کەتەماشـای داخوازیکـار بکـەیت بـەڵام سـنووری شـەرع بپارێزیـت، بەتەنها نەبن، تەوقە نەکەن، پۆشاکی ناشەرعی لەبەر مەکە.

٥ـ هەندێك لەخێزانەکان ئاهەنگ دەگێڕن بەتێکەڵاوی لـەڕۆژی مارەبڕینـدا، داواکـار دەچـێتە شـوێنی ئاهـەنگ و کچـەکەش بـەڕازاوەیی دادەنیشـێت، پیاوەکـەیش

لەتەنیشتی دادەنیشێت و ئەڵقەی لەدەست دەکات لەپێش چاوی خەڵکی، وریابە ئاسانکاری مەکە.

٦- وورپای زۆر دەرچوون و یەکتربینین و زۆر قسەکردن بە ئەگەر بەتەلەفۆنیش بێت لەپێش مارەبڕیندا.

٧- واباشترە پشکنینێکی پزیشکی بکرێت پێش هاوسەرگیری بۆ زانینی هەرشتێك کەپێویستە بزانرێت.

## لەمافەکانت پێش هاوسەرگیری

١- خاوەن فەرمان (ولي الأمر) پێویستە ڕێگەت پێ بدات بۆ ڕازی بوون یان ڕەتکردنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لا تنكح الأيم حتى تستأمر ، ولا تنكح البكر حتى تستأذن ، قالوا يارسول الله! وكيف إذنها؟ قال إن تسكت)).

واتە : نابێت بێوەژن بە شوو بدرێت و مارەیی نایەت تاوەکو خۆی بڕیار نەدات ، وە کچیش نابێت بە شوو بدرێت و مارەیی نایەت تاوەکو ئیزن و بۆچوونی وەرنەگیرێت ، ووترا : ئەی پێغەمبەری خوا ئیزن لێ وەرگرتنی کچ چۆنە ؟ فەرمووی : ئەوەیە کە بێدەنگ دەبێت .

٢ـ دروستە پیاو کچەکەی پێشکەش بەکەسی شیاوو چاك بکات، بزانە چاخی یەکەم لەهاوەڵان دەگەڕان بەدوای مرۆڤی چاکدا بۆ کچانیان، زۆر بەڕاشکاوی وەکو ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) و پێشینانی چاکەکار.

٣- دروست نیيە کەخاوەنت ڕێگربێت لەشووکردنت بەبیانووی تەواوکردنی خوێندن و بەدەست هێنانی بڕوانامەو فەرمان، بەڵکو دەتوانیت هەردووکی بکەیت ئەگەر بۆت گونجا، لەبیرت نەچێت کەماڵ و مێردو پەروەردەکردنی منداڵ یەکەم کارن بۆ ئافرەت.

٤ـ ئاگاداربە نەکەی مەرج بۆ پیاو دابنێیت بەتەڵاق دانی ژنەکەی تری ئەگەر هەیبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((لايحل لامرأة تسأل الطلاق أختها ، لتستفرغ صحفتها، فإنما لها ما قدر لها)) (رواه البخاري).

واتە : حەڵاڵ نیيە بۆ ئافرەت کەوا دواخوازی تەڵاق دانی خوشکەکەی بکات بۆ ئەوەی قاپەکەی بەتاڵ بکات بۆ خۆی ، بەڵکو ئەوەی بۆ هەیە کە بۆی دانراوە لە لایەن خواوە .

## ﴿ئاهەنگی گواستنەوە﴾

١ـ سووربە لەسەر ئاهەنگ گێڕانی شەرعی دوور لەخراپەکاری و تاوان و سەرپێچی کردن و تێکەڵاوی بەبیانووی ئەوەی کەئاهەنگەکە خێزانیيە، وەنەکەن بووك و زاوا

بەرزبکرێنــەوە لــەپێش چـاوی خــەڵکی، هێنــانی گـۆرانی بێـژو کاسـێتی گـۆرانی لەڕێگەی بڵندگۆیی دەنگی‌یەوە، وەشەونخوونی کردن بەوێنەگرتن.

٢ـ دروستە مارەبڕین ئاشکرا بکرێت بەدەف و سروودی ڕێگـەپێ دراو ، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((فصل مابين الحلال والحرام الدف والصوت)) (أصحاب السنن).

جیاکەرەوەی نێوان حەڵاڵ و حەرام دەف لێدان و دەنگ دەربڕینە .

٣ـ ئاگاداربە لەنەریتی چاولێکەری خراپ، وەکو شەبقەو ئەڵقەکردنە پەنجەی بـووك لەلایـەن زاواکـەوە داب و نـەریتی گاورەکانـەو بنچـینەیەکی بیروبـاوەڕی هەیـە لای ئەوان.

الدخلة:

١ـ هەوڵ بدە پەرتووك بخوێنیتەوە دەربارەی ژیانی هاوسەرگیری شەرعی.

٢ـ ئاگاداربە لەخوێندنەوەی ئـەو گۆڤـارو پەرتووکـە جنسـی‌یانەی دوور لـەڕێنمایی شەرعین.

٣ـ هەر شتێکت لەلا ئاڵۆزە پرسیار بکە لەو هاوڕێیانەت کەجێگای متمانەن.

٤ـ خۆت بڕازێنەوەو بۆنت خۆش بکە بۆ هاوسەرەکەت، وەئاگاداری برۆ هەڵگرتن و قژی دەستکردو قژبڕین بە لەسەر شێوازی پیاوان چونکە هەموو ئەمانـە لەشـەرعدا قەدەغەکراون.

٥- دوو ڕکات نوێژ بکە لەگەڵ هاوسەرەکەتدا، کەئاماژەیە بۆ ئەوەی کەمەبەست لەهاوسەرگیری هەڵسانە بەئەرکێکی ئایینی و پەروەردەکردنی منداڵ.

٦- بەڵێ شەرم لەباوەڕەوەیە، بەلاَم زیادەڕەوی تێدامەکە تا مێردەکەت لێت بێزار نەبێت.

٧- ئاگات لەقسەو گوفتارت بێت وەنەرم و نیان بەو هەستی بریندار مەکە.

## مافەکانی پیاو لەسەر خێزانی

١ ـ شەرعی پیرۆز هانی ئەوەی داوە کەگوێڕایەڵی هاوسەرەکەت بکەیت و ڕازی بکەیت ئەگەر تاوان نەبێت، ئەمە گەورەترین مافە بەسەر ئافرەتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((إذا صلت المرأة خمسها، وصامت شهرها، وحصنت فرجها، وأطاعت زوجها، قيل لها: أدخلي الجنة من أي أبواب الجنة شئت)) (صحيح ابن حبان).

واتە : ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژەکەی ئەنجامبدات ، و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت ، دامێنی بپارێزێت ، و گوێڕایەڵی مێردەکەی بکات ، پێی دەوترێت : بڕۆڕە ناو بەهەشتەوە لە هەر دەرگایەك لە دەرگاکانیەوە ویستت لێیەتی .

٢- ئاگاداربە نەبیتە هۆی دوودڵی هاوسەرەکەت ئەگەر پێویستی خێزانی هەبوو، یاخود بیانوو بهێنیتەوە، چونکە هەڕەشەی سەخت هاتووە بۆ ئەو ئافرەتانە،

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:** ((إذا دعا رجل أمرأته إلى فراشه، فأبت، فبات غضبان، لعنتها الملائكة حتى تصبح)) (رواه البخاري).

**واتە : ئەگەر پیاو بانگی خێزانەکەی کرد بۆ سەر جێگا و ئەویش خۆی گرتەوە و مێردەکەشی بە تورەیی خەوت ئەوا فریشتەکان نەفرەتی لێدەکەن تاوەکو ڕۆژی لێدەبێتەوە .**

**٣ـ خۆت بەخۆشەویست و نەرم و نیان ڕابگرە تا هاوسەرەکەت هەست بەئارامی بکات، خوای گەورە دەفەرموێت:** {وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ} (سورة الروم: ٢١).

**واتە : لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورە ئەوەیە کە لە خوودی خۆتان خێزانی بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی لە پەنایدا ئارامبگرن و لە نێوانیاندا دۆستایەتی و بەزەیی پەیدا کردووە ، بەڕاستی ئەوە نیشانەی تێدایە بۆ خەڵکانێك بیربکەنەوە و تێبفکرێن .**

**ئاگاداری کاتی خواردن و خەوتنی بە، چونکە برسێتیو نەخەوتن تووڕەبوونیان لەدواوەیە، هەروەکو چۆن لەئامۆژگاری ئافرەتە دەشت نشینەکە هاتووە بۆ کچەکەی کەپێی دەڵێت: ئاگاداربە لەزۆر گلەیی و ناڕەزایی لەسەر ئیش و کارو**

میوان، چونکە ئەبێتە هۆی ڕاکردنی پیاو لـەماڵ، وەئـارام بگـرە چـونکە پاداشـتت دەست دەکەوێت إن شا ء الله.

٤ـ خـۆت بڕازێنـەوە بـەکل و دەسـت نوێـژگرتن و بـۆن خـۆش کـردن و بایەخـدان بەخاوێنی تاببیتە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی و چاوی پارێزراو بێت لەبینینی حەرام، بەلأم زیادەڕەوی مەکە بەشێوەیەك زۆربەی کات لەبەرامبەر ئاوێنە بەسەر بـەریت، قيـل لرسـول الله (ﷺ) : أي النسـاء الخير؟ قـال: ((الـتي تسـره إذا نظـر، وتطيعـه إذا أمـر، ولاتخالفه في نفسها ومالها بما يكره)) (أخرجه ابو داود).

واتـە : وتـرا بـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چـاکترین ئـافرەت کامەیـە ؟ فـەرمووی : ئەوەیـە کاتێـك مێردەکـەی سـەیری دەکـات دڵـی خـۆش دەکـات ، وە گوێڕایـەڵی دەکات ئەگەر فەرمانی پێکرد ، وە پێچەوانەی ناکات لە خۆیدا و لە ماڵیدا بەوەی کە پێی ناخۆشە .

٥ـــ خزمــەت کردنــی پیــاو پێویســتە بەتایبــەتی لەپــەروەردەکردنی منــداڵ و ئامادەکردنی خواردن و جێگاو.. وەچاو بکـە لەکچـانی پێغەمبـەر (ﷺ) و أسمـائی کچی أبوبکر (خوایان لێ ڕازی بێت).

٦ـ پێویستە لەسەرت نهێنیەکانی پیاوەکەت بپارێزیت بەتایبـەتی نێـوان خۆتـان، پێغەمبــەر (ﷺ) دەفــەرموێت: ((إن مـن شـر النـاس عنـد الله مترلـة يـوم القيامـة الرجـل يفضـي إلى المرأة وتفضـي إليـه، ثم ينشـر سـرهما)) (رواه مسلم).واتــە : بەڕاسـتی خـراپترین

خـەڵك لای خـوا لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئـەو پیاوەیـە کـەوا دەچـێە لای خێزانەکـەی و ئەویش دەچێتە لای مێردەکەی ، ئەنجا نهێنی نێوانیان ئاشکرا دەکەن .

٧- خـۆت بپـارێزە لـەکاتی دیارنـەبوونی هاوسـەرەکەت و ناپـاکی لێ مەکـە، خـوای گەورە دەفـەرموێت: {فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ} (سورة النساء: ٣٤).

واتە : ئەو ئافرەتە چاك و گوێڕایەڵ و نهێنی پارێزانە بەوەی کە خوا دەیپارێزێت .

٨ــ خـۆت بپـارێزە لــەدڵ پیسـی کـردن لـەپیاو چـونکە کلیلـە بـۆ تەلاّقـدان، دووربکەوەرەوە لەزۆر پرسیارکردن و لەوانە مەبە کەگیرفان دەگـەڕێن و چـاودێری تەلەفۆن دەکەن بەتایبەت ئەگەر خێزانی تری هەبوو.

٩ـ شیردان بەمنداڵ و بەخێوکردنی، ئەمە بکـە بەپـەرسـتنێکی بـەرزو نیـەتی خـۆت چاك بکە تا بەرهەمەکەیت دەست بکەوێت، خوای گـەورە دەفـەرموێت: {وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ} (سورة البقرة: ٢٣٣).

واتە : دایکان شیر دەدەن بە منداڵەکانیان دوو ساڵی کامڵ بۆ ئەوەی کە دەیەوێت شیردان تەواو بکات .

١٠ـ جێـی متمانـەی پیاوەکـەت بـە لـەماڵ و سـامانی، دروسـت نیـە دەسـتکاری بکەیت بەبێ ڕەزامەنـدی ئـەو، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ((المرأة الراعية في بيت زوجها، ومسؤولة عن رعيتها)).

واتە : ئافرەت سەرپەرشتیاری ماڵی مێردەکەیەتی و بەرپرسیارە لە بەڕێوەبردنی.

بەبێ ئیزنی پارە دەرمەکە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لایجوز لامرأة عطية إلا بإذن زوجها)) (أخرجه أبو داود).

واتە : دروست نیە بۆ ئافرەت ماڵ ببەخشێت ئیللا بە ئیزنی مێردەکەی نەبێت .

١١- ڕێگە بەکەس مەدە بۆ ماڵی بەبێ ئیزنی هاوسەرەکەت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لايحل للمرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا بإذنه، ولا تأذن في بيته إلا بإذنه)) (متفق عليه).

واتە: دروست نیە بۆ ئافرەت بەڕۆژووی سوننەت بێت بەبێ ئیزنی پیاوەکەی، وەدروست نیە ڕێگە بەکەس بدات بۆ ماڵەکەی بەبێ ئیزنی ئەو، واتە ڕێگە بەکەسێك نەدات کەپیاوەکەی ڕقی لێ بێت یان پێی ناخۆش بێت.

١٢- بەبێ ئیزنی هاوسەر بەڕۆژووی سوننەت نەبێت ئەگەر لەماڵ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لايحل للمرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا بإذنه، ولا تأذن في بيته إلا بإذنه)) (متفق عليه).

واتە : دروست نیە بۆ ئافرەت بەڕۆژووی سوننەت بێت بەبێ ئیزنی پیاوەکەی، وەدروست نیە ڕێگە بەکەس بدات بۆ ماڵەکەی بەبێ ئیزنی ئەو، واتە ڕێگە بەکەسێك نەدات کەپیاوەکەی ڕقی لێ بێت یان پێی ناخۆش بێت.

١٣ــ لــەماڵ دەرمەچــۆ بــەبێ ئیزنــی ئــەو، وەمەچــۆ دەرەوە بــۆ پێویســتی و بەرژەوەندی‌یەکی شەرعی نەبێت، خــوای گــەورە ئەفــەرموێت: {وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ } (سورة الأحزاب: ٣٣).

١٤ـ چاوپۆشـین لەهەڵـەکانی بەتایبـەتی هەڵەیـەك کەمەبەسـت نـەبێت، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((كل بني آدم خطاء، وخير الخطائين التوابون)) (أخرجه الترمذي).

واتە: هەموو ئادەمیزادێك هەڵە دەکات، بەڵام باشترین هەڵەکاران ئەوانـەن کەتۆبـە دەکەن و دەگەڕێنەوە. وەئاگاداربە زۆر ڕەخنە مەگرە چونکە دەبێتە هۆی تـووڕە بوون و ڕق لێ بوون.

١٥ـ خۆت دوور بگرە لەمشت و مڕ لەکاتی تـووڕە بوونیـدا، باشـتروایە قسـەی پـێ نەبڕیت و باش گوێی لێ بگریت هەتا هێمن دەبێتەوە پاشان لەیەك تێ بگەن، هەوڵ بدە خـۆت دووربخـەرەوە لەهـەموو ئـەو شـتانەی تـووڕەی دەکـات تـا ڕەزامەنـدی خوای گەورە بەدەست دێنیت، لەیادت نەچێت هەر ئەوە هـۆی دۆزەخ و بەهەشـتی تــۆ، هــەوڵ بــدە ڕازی بکــە بەهــەموو هۆکــارێکی شــەرعی، پێغەمبــەر (ﷺ) دەفــەرموێت: (( نساؤكم من أهل الجنة: الودود، الولود، العؤود على زوجها، التي إذا غضب جاءت حتى تضع يدها في يد زوجها، وتقول: لا أذوق غمضا حتى ترضى)).

واتە: خێزانی بەهەشتی خۆشەویست و منداڵ خەرەوەیە، دەگەڕێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی کەتووڕە بێت دەستی دەگرێت و پێی دەڵێت: نانووم تاڕازی نەبیت لێم.

١٦- ڕاستگۆبە لەگەڵی بەتایبەتی لەکاتی نائامادەبوونیدا، دووربە لەدرۆ چونکە ئەگەر لێت دەرکەوێت متمانەی پێت نامێنێت، وەئەگەر متمانە نەما پەیوەندیتان خراپ دەبێت.

١٧- بەشداری کردنی ویژدانی لەخۆشی و ناخۆشیدا لەگەورەترین هۆکارەکانی خۆشەویستییە، ئاگاداربە خۆشحاڵی دەرنەبڕیت لەکاتی غەم و پەژارەیدا، وەدڵتەنگی دەرنەبڕیت لەکاتی دڵخۆشیدا، چونکە بەشداری کردن لەخۆشیدا زیاتری دەکات، وەلەناخۆشیدا سووکتری دەکات، هاوشانی و یارمەتی بدە لەئارام گرتن و بۆچووندا.

١٨- ڕێز لەمیوان و کەس و کارو خزمی هاوسەرەکەت بگرە بەتایبەتی دایك و باوکی چونکە ئەوان لەتەمەنی دایك و باوکتدان، وەڕەوشتێکی شەرعی ڕەسەنە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (( ليس منا من لم يجل كبيرنا، ويرحم صغيرنا، ويعرف لعالمنا حقه)) (رواه أحمد).

واتە: لەئێمە نییە کەسێك ڕێز لەگەورە نەگرێت و بەزەیی بەبچووکدا نەیەتەوەو مافی زانامان نەزانێت.

**١٩ـ ڕازیبە بەوەی هاوسەرەکەت بۆت دابین دەکات لەخواردن و خواردنەوەو پۆشاك و... جگە لەمانە کەلەتوانایدایە، وەسوپاسی بکەو نکوڵی مەکە، چونکە دەبێتە هۆی چوونە دۆزەخ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:** (( أريت النار، فإذا أكثر أهلها النساء يكفرن، قيل: أيكفرن بالله؟ قال: يكفرن العشير، ويكفرن الإحسان، ولو أحسنت إلى إحداهن الدهر، ثم رأت منك شيئا، قالت: ما رأيت منك خيرا قط)).

**واتە: دۆزەخم نیشان درا، بینیم زۆربەی خەڵکی ناوی ئافرەت بوون،و نکوڵی دەکەن. ووترا: ئایا نکوڵی لەخوای گەورە دەکەن؟ فەرمووی: نکوڵی چاکەی هاوسەرەکانیان کردووە، ئەگەر بەدرێژایی تەمەن چاکەیان لەگەڵ بکەیت پاشان شتێکت لێ ببینن، دەڵێن: هیچ چاکەیەکم لێت نەبینیوە.**

**٢٠ـ ئافرەتی چاك داوای تەڵاق و جیابوونەوە لەهاوسەرەکەی ناکات بەبێ هۆیەکی شەرعی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:** ((أيما أمرأة سألت زوجها طلاقا من غير بأس، فحرام عليها رائحة الجنة)) (أصحاب السنن).

**واتە: هەر ئافرەتێك داوای جیابوونەوە بکات لەهاوسەرەکەی بەبێ هۆیەکی شەرعی، ئەوا بۆنی بەهەشت حەرامە لەسەری.**

## ئەمە مافەکانتانە بیزانن

**١ـ مارەیی دیاری یەکی خوای گەورەیە بۆت، خوای گەورە دەفەرموێت:** {وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً } (سورة النساء: ٤).**واتە : مارەیی بدەن بە ئافرەتان وەکو**

دیارییەك . پیاو بۆی نییە زۆرت لێ بکات کەشتێك لەمارەیەکەت لێ بسێنێت بەبێ ڕەزامەندی، خوای گەورە دەفەرموێت: { فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا} (سورة النساء: ٤). واتە : ئەگەر دڵیان پاك بوویەوە لە شتێك لە مارەییەکەیان ئەوا بە حەڵاڵی بیخۆن .

٢ـ دابین کردنی پێداویستییەکانت، خوای گەورە دەفەرموێت: {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ} (سورة النساء: ٣٤). کەخواردن و خواردنەوەو پۆشاك و شوێن دەگرێتەوە.. وەپێویستە لەسەر پیاو ئەگەر ژنەکە دەوڵەمەندیش بوو، بەڵام پێویستە لەسەر ژنەکە داوای شتێکی لێ نەکات کەلەتواناییدا نەبێت.

٣ـ مافی خۆتە لەسەر هاوسەرەکەت کەغیرەتی هەبێت بەسەرتەوەو بتپارێزێت لەهەموو شتێك کەئازارت بدات.

٤ـ مامەڵەکردن بەچاکە: خوای گەورە دەفەرموێت: { وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ} (سورة النساء: ١٩) . واتە: هەڵس و کەوتتان چاك بێت لەگەڵیاندا وەنەرم و نیان بێت و ڕەق و توندو تیژ نەبێت بەبێ تاوان، هەروەها دادپەروەر بێت لەنێوان خێزانەکانیدا ئەگەر زیاتر لەژنێکی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((من كانت له أمرأتان يميل لإحداهما عن الأخرى جاء يوم القيامة يجر أحد شقيه ساقطا أو مائلا)) (رواه الترمذي).

واته: هەرپیاوێك دوو ژنـی هـەبوو، بـەلای یەكێكیانـدا لایـدەدا ئـەوا لـەڕۆژی قیامەتـدا لایـەكی بەربۆتەوەو ڕایدەكێشێت و یاخود لالەنگە.

وەلەمامەڵەكرنی چاكە ڕێزلێنان لەكەس و كارت و بانگ كردنیان لەبۆنەكانداو چاكەكردن لەگەڵیاندا.

وەلەمامەڵەكردنی چاكە ئەوەیە نەخۆش كەوتیت چارەسەرت بكات.

٥ـ گوێڕایـەڵی هاوسـەرەكەت نەكـەیت لەشـتێكدا كـەبۆی حـەلاڵ نیـیەو تاوانـە، وەكـو داواكردنی لەكاتی بـێ نوێـژی و زەیسـتانی و لـەكاتی بـەڕۆژوو بـوونی فـەرز، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لاطاعة لبشر في معصية الله، إنما الطاعة في المعروف)) (رواه البخاري).واتە: گوێڕایەڵی نیـیە بۆ هیچ مرۆڤێك لەسەرپێچـی خـوای گـەورەدا، بـەڵكو گوێڕایـەڵی تـەنها لەچاكەدا ئەبێت.

٦ـ ئەگەر هاوسەرەكەت لەحەق لایدا ئەوا ئامۆژگاری بكە، وەئەگەر بـەردەوام بـوو ئـەوا سەرپێچی بكە، چونكە ئافرەتی موسڵمان دروست نیـیە لەلای كافر بمێنێتەوە.

٧ـ حەرامـە بـەبێ هۆیـەكی شـەرعی لێـت دووربكەوێتـەوە، چـونكە فـەرمانی پـێ دراوە كەمافت بدات.

٨ـ مافی خۆتە لەسەر هاوسەرەكەت كەبتپارێزێت لەئاگر بـەفێركردن و پـەروەردەكردن، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ} (سورة التحريم: ٦).

واتە: ئەی باوەڕداران خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لەئاگرێك کەسووتەمەنی‌یەکەی خەڵکی و بەردە، فریشتەی دڵ ڕەقی ئەستووری لەسەرە بێ فەرمانی خوای گەورە ناکەن وەچی فەرمانیان پێ بکات جێ بەجێی دەکەن.

ئیمامی عەلی (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((خۆتان و کەس و کارتان فێری چاکە بکەن و پەروەردەیان بکەن))، الألوسی دەفەرموێت: ((ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەپێویستە لەسەر پیاو ئەوەی کەفەرزە لەسەری بیزانێت و کەس و کاری فێربکات..))

ئەگەر هاوسەرەکەت بەمە هەڵنەسا پێویستە لەدەرەوە فێری بنچینەکانی دینەکەت بێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((طلب العلم فريضة على كل مسلم)).واتە: گەڕان بەدوای زانیاریدا فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك.

٩ـ دروست نی‌یە هاوسەرەکەت ڕێگریت بکات بەهەڵسان بەئەرکە دینی‌یەکانت وەکو بانگەوازکردن بۆ لای خواو سەرخستنی دین بەبیانووی ئەوەی کەتۆ ئافرەتیت و گرنگترین ئەرکت ماڵ و منداڵە.. ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرت (ﷺ) لەیادبێت کەدەفەرموێت: ((النساء شقائق الرجال)).

واتە: ئافرەتان هاوشانی پیاوانن. بەڵام ئاگاداری هاوکێشەبە ماڵەکەت پشت گوێ نەخەیت بەبیانووی ئەرکی دینی.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته ...